# پوختەی زانستەکانی

# قورئان





ئامادەکردنی:
جەزا بارامی

پێداچونەوەی
م.صباح ڕەسول شارستێنی
م.نەرمین رحمن حمە

چاپی یەکەم

٢٠١٤ زاینی
١٤٣٥ کۆچی

(( إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾

)) (الحجر:9)

ناوی کتێب: پوختە ی زانستە کانی قورئان

زنجیرە :زانستەشەرعییەکان(1)

نوسینی: جەزا بارامی

پێداچونەی: م.صباح رسول شارستانی م.نرمین رحمان حمە

تایپ: یعقوب احمد

د یزانین: سەرکۆ کریم

بەرگ: چاپخانە ی ڤاری

تیراژ: 200لاپەڕە

ژمارەی لاپەڕە:77لاپەڕە

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ:1435-2014

شوێنی چاپ: چاپخانەی شارستان

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (1215)ی ساڵی(2014)ی پێدراوە.

## پێشه کی

ان الحمد الله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضل فلا هادي له واشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له واشهد ان محمدا عبده ورسوله.

اما بعد:

فان اصدق الحديث كتاب الله ،وخيرالهدي هدي محمد(صلى الله عليه وسلم) ،وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار.

سوپاس بۆ ئه وزاته ی که ئێمه ی گێڕاوه به کۆتا ئوممه‌ت وڕێزداری کردوین به کۆتا په یامی خۆی که قورئانی پیرۆزه،په یامێك که پڕه له شتی سه رسوڕهێنه‌ر،په یامێك که هه‌موو سیاسه تمه دارو ڕه وانبێژو زمانزان ویاسا ناس وده رووناناس

ناوی کتێب: پوختە ی زانستە کانی قورئان

زنجیرە :زانستەشەرعییەکان(1)

نوسینی: جەزا بارامی

پێداچونەی: م.صباح رسول شارستانی م.نرمین رحمان حمە

تایپ: یعقوب احمد

د یزانین: سەرکۆ کریم

بەرگ: چاپخانە ی ڤاری

تیراژ: 200لاپەڕە

ژمارەی لاپەڕە:77لاپەڕە

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ:2014-1435

شوێنی چاپ: چاپخانەی شارستان

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (1215)ی ساڵی(2014)ی پێدراوە.

## پێشه کی

ان الحمد الله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضل فلا هادي له واشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له واشهد ان محمدا عبده ورسوله.

اما بعد:

فان اصدق الحديث كتاب الله ،وخيرالهدي هدي محمد(صلى الله عليه وسلم) ،وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار.

سوپاس بۆ ئه وزاته ی كه ئێمه ی گێڕاوه به كۆتا ئوممەت وڕێزداری كردوین به كۆتا په یامی خۆی كه قورئانی پیرۆزه،پە یامێك كه پڕه له شتی سه رسوڕهێنەر،په یامێك كه هەموو سیاسه تمه دارو ڕه وانبێژو زمانزان ویاسا ناس وده روونناس

و كۆمه ڵناس ونووسه رو ڕۆشنبیرێك له به ر ده میدا ده سته وسانن وچۆكیان داداوه.

به ڕێزان ئه م به ر هه مه ی به ر ده ستتان كه زنجیرەیەكه سه ره تا به وتنه وه مان به كۆمه ڵێك خوشك وبرا ده ستی پێ كرد له گه ڕه كی خۆمان دواتر كردمانن به مه لزه مه و دوای ئه وه ش به هۆی هه ولْ وشه ونخونیمان بۆیان بیر مان له وه كرده وه بۆ ئه وه ی ئه وهه وڵه مان به فیڕۆ نه چێت بیانكه ین به كتێب وخێرو بێره كه ی هه مووان بگرێته وه كه سوپاس بۆخوا ئێستا دوای هه ولی چه ند ساڵه وا باخه كه مان به ری گرت وله به رهه مه كه ی ده خۆین، به ڕاستی چۆكدادان له خزمه تی ئه م زانسته شه رعییانه تام و چێژی تایبه ت به خۆیان هه یه، شێوازی نوسینه كه ش پوخته یه كه وبۆ سه ره تایی یه كه زیاتر ده توانن به ده رس له مالآن و شوێنه گشتییه كان لێی سودمه ندبن،هه ولْمانداوه پوختەیه كی گشتگیربیْ وسه رجه م باسه كانی ئه م زانسته ی له خۆ گرتبێت مه گه ر بابه تێك كه زیاتر ده ست بدات بۆ زانستێكی تر وه ك(عام وخاص) و(مطلق ومقید)كه باسه كانیان زیاتر بۆ زانستی بنه ماكان (اصول) ده ست ده دات،یان بابه ت هه یه خیلا ف له سه ر بوون ونه بوونی هه یه وزۆر به گوشراوی هێناومانه وه ك نه سخ ،یان چه ند

بۆچوونێکی لـه سـەره لـه مانـه شـدا خۆمـان مانـدوو کـردووه بـه هێزترین وراستترین بۆچوون پێشکه ش بکه ین وه ك یـه کـه م نووسه ری ئەم زانسته و یه کەم وکۆتا ئایه ت که دابه زیوه ئه م به رهـه مـه یـه کـه م بـه رهـه مـه لـه و زنجـیره ی کـه نـاو مـان ناوه (زنجیره ی زانسته شه رعییه کان) پشتیوان به خـوای گـه وره زنجیره کانی تریش یه ك به یه ك به دوای یه کتردا دێن.

لـه کۆتایـدا زۆر سوپاسـی مامۆسـتا بـه ڕێـزه کـانم لـه کۆلێـژی زانسته ئیسلامییه کانی زانکۆی سلێمانی ده کـه م کـه ئـه رکـی پێداچونه وه ی کتێبه کانیان گرته ئه ستۆ خـوای گـه وره بـه ره که ت بخاته ته مه نیانه وه و زیاتر قه ڵه میان به بڕشت بکات

نووسه ر/سلێمانی

2014/1/25زاینی

26ڕه بیعی یه کەمی1435کۆچی

## پێناسه کەی

زانســتەکان (علــوم ) کــۆی (علــم ) ە هاومانــای تێگەیشــتن و ناسینە.

قورئان لە زمانەوانیدا لە (قراءة ) ەوە هاتووە واتە: خوێندنەوە یان زۆر خوێندراو.[1]

لە زاراوە دا: وتەی ئیعجازی خوای گەورە یە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لە پەڕاوەکاندا نوسراوە و بە متەواتیری بە ئێمە گەیشتووە و خوێندنەوە ی پەرستشە .[2]

**سودەکەی :** خۆ ئامادە کردنە بۆ چاك بەرگری کردن لە پاراستنی قورئان و،پاشان بە ئاسانی ڕاڤە کردنی.[3]

**بابەتەکــەی:** هــەموو ئــە و بابــە تانــە یــە کــە پەیوەنــدییان بــە قورئانەوە هەیە .[4]

---

[1]- مناهل العرفان (1/9-11) .

[2]- النبا العظيم (41/1) .

[3]- علوم القران الكريم (75) .

دانەرەکەی : زانستەکانی قورئان هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) هەبووە بە کورتی،بەلأم وەك زانستێکی سەر بە خۆ یەکەم کەس (عەلی کوڕی إبراهیمی کوڕی سەعید) ناسراو بە (حوفی) نوسی کە ،سالی (430) ه کۆچی دوایی کردووە و ناوی کتێبەکەشی (البرهان في علوم القران ) ە.[5]

## ناوەکانی قورئان

تە نها ئە م چوارە یە (قران ،کتاب ، ذکر، فرقان).[6]

## سیفەتەکانی قورئان

(هدی ،شفاء،رحمة ،موعظة ،بشری ،عزیز ،مجید ،مبارك ،برهان ، روح) هتد.

کە هە ند ێك لە زانایان گە یاندویانەتە سە د سیفە ت.[7]

---

[4]- المصدر السابق (75) .

[5]- مناهل العرفان (26/1) .

[6] - تفسیر الطبري (94/1) ؛ علوم القران (7-8)

[7] - البرهان (273/1-276) .

**قورئـــان و فـــەرموده :** قورئـان لـه پێشـدا پێناسـەکەمان کـرد، فـەرموودەش بـه گشـتی دوو بەشـه (فـەرموودەی قودســی ، فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) .

فەرموودە ئەوەیە ئەدرێتە پاڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە وتە یان کردەوە یان دانپیانان یان سیفەت .

فەرموودەی قودسی: ئەوەیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەیداتە پاڵ خوای گەورە .[8]

**جیاوازی نێوان قورئان و فەرموودەی قودسی:**

1. قورئان وتەی خوایە و تە حەدای مرۆڤ وپە ری دەکات ،بەڵام فەرموودەی قودسی ئە و تەحەدایە ناکات

2. قورئـان ڕاسـتە وخـۆ دەدرێتـە پـاڵ خـوای گـەورە ،بـەڵام فـــەرموودەی قودســـی پێغەمبـــەر (صـــلی الله علیـــه وســـلم) ئەیگێڕێتەوە و ئەیداتە پاڵ خوای گەورە.

3. قورئان هـەمووی بە متـەواتیری گەیشـتوە بـە ئێمـە و (قطعي الثبـوت ) ە ،بـەڵام فـەرموودەی قودسـی زۆربـەی ئاحادەو (ظني الثبوت) ە .

---

[8] – تیسیر مصطلح الحدیث (160) ، علوم القران (21) .

4. قورئـان خوێندنـەوەی پەرستشـە و نوێـژ  بـە بـێ ئـەو بەتاڵـە ،بــەڵام فــەرموودەی قودســی خوێندنــەوەی پەرســتش نیــە و خوێندنەوەی نوێژ بە تـاڵ دەکاتـەوە (مـە گـە ر زکـرو نزایـە ك لـە نوێژدا بێ).

5. قورئان وشەو مانای لە خوای گەورەوەیـە ،بەڵام فەرموودەی قودسی مانای لە خواوەیە وشە و دەربڕینی  لە پێغەمبەرەوەیە.

6. خوای گە ورە بە ڵێنی پاراستنی قورئانی داوە ،بـە ڵام بۆ فـە رموودە ی قودسی وانییە

7. دروست نییە قورئان بە مانا بگێڕدرێتە وە، بە ڵام بۆ فە رموودەی قودسی دروستە.[9]

**باسی سورەت**

سورەت لە زمانەوانیدا واتە (شورا) .

لـە زاراوەدا:کۆمـەڵێك ئایـەتی قورئانـە و سـەرەتا وکۆتـایی هەیـە .[10]

---

[9] - مباحث في علوم القران (24-25) ، دراسات (21-23) .

[10] - علوم القران الكريم .

سورەتەکانی قورئان دریژ و کورتی هەیە درێژترینیان سورەتی (البقرة) و کورتترینیان سورەتی (الکوثر) ە،ژمارەی سەرجەمیان (114) سورەتە، پاشان دەبن بە چوار بەشەوە کە ئەمانەن:

1. درێژەکان (الطوال )کە ئە مانە ن (البقرة، ال عمران ، النساء ،المائدة ،الأنعام ،الأعراف ،یونس ) یان (التوبة والانفال)ە.

2. سەدییەکان (المئـون) ئـەو سـورەتانەن کـە ژمـارەی ئایەتەکانیان زیاتر لە سە د ئایەت یان نزیکەی سەدە.

3. دووبارەکان (المثاني ) :ئەو سورەتانەن کە لە دوای سە دییە کان دێن .

4. جیاجیاکان (المفصّل ) لە سورەتی (ق ) یان (الحجرات)ە وە تا کۆتایی قورئانە.[11]

باسی ئایەت

ئایەت لە زمانەوانیدا واتە ( نیشانە) .

لـە زاراوەدا:کۆمـەڵێك وتـەی خوایـە لـە ناوەنـدی سـورەتێکی قورئاندا دانراوە و سەرەتاو کۆتایی هەیە،[12] ئایـەتیش درێـژ و

---

[11] – مباحث (130) ، فضائل القران لابن الفريس (74) .

[12] – البرهان (266/1) .

کـورتی هەیە،درێـژترین ئایـەت ئایـە تـی﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ ﴿٢٨٢﴾ ﴾ البقرة

و کورتترین ئایەتیش ئایەتی ﴿ وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ ﴾ یەکەم ئایەت کە دابەزی ئایەتی﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ کۆتا ئایە تیش کە دابــەزی ئایـــەتی ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾ ﴾ .[13]

## ڕێکخستنی ئایەت و سورەتەکان

ڕێکخستن (ترتیب ) ی ئایەتە کان تە وقیفی یە و بە فە رمانی پێغــە مبــە ر (صــلی اللــە علیــە وســلم)بــووە، ڕێکخســتنی ســـورەتەکانیش هـــە نـــدێکی تـــە وقیفـــی وبـــە فـــەرمانی پێغەمبـەر(صـلی اللـە علیـە وسـلم) و بـە شـە کـەی تریشـی بـە ئیجتیهادی هاوەڵان بووە .[14]

[13] - الاتقــان (1/33-38) ،المرشــد الــوجيز (1/33) ، البرهــان (1/206-210) ، الانتصــار (236-247).

[14] - البرهان (1/235)، الاتقان(1/98)،المرشدالوجيز (1/33)،اسرار ترتيب القران (41-48) .

## نیگا :

**نیگا(وحی) لە زمانەوانیدا (ئاماژەی خێرا )دەگەیەنێت .**

**لە زاراوەدا : دابەزینی وتەی خوایە بۆ سەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی .[15]**

## جۆرە كانی نیگا

1. بینینی خەونی ڕاست و هاتنەدی خەونەكان .
2. هاتنی فریشتە لە كاتی بێداریدا و بە بێ ئەوەی ببینرێت .
3. هاتنی فریشتە لە سەر شێوەی مرۆڤێكی ئاسایی .
4. هاتنی فریشتە لە سەر شێوەی خۆی .
5. نیگا كردن لە سەر شێوەی ئیلهام خستنە ناو دڵەوە .
6. هاتنی فریشتە بە ڕاستە و خۆ و بە بێ پە ردە.
7. هاتنی نیگا لە پشتی پە ردە وە.[16]

---

[15] – مباحث (29) .

[16] – علوم القران الكريم (21-22) .

## قۆناغه كانى دابەزینى قورئان

خواى گەورە بە سىٰ قۆناغ قورئانى دابەزاندووە كە ئەمانەن :

1. لە لایەن زاتى خواى گەورەوە بۆ تە ختى پارێزراو (لوح المحفوظ ) وەك خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ البروج واتە: بەڵكو ئەوە قورئانێكى بەرز و بەرێزە و لە(لوح المحفوظ ) دایە .

2. لە (لوح المحفوظ ) ەوە بۆ ئاسمانى دونیا لە مانگى ڕەمەزاندا ، وەك خواى گەورەدەفە رمویٰ:

﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة

واتە: مانگى ڕەمەزان ئە و مانگە یە كە قورئانى تیا دابەزیوە.

3. لە ئاسمانى دنیاوە بۆ سەر زەوى لە ماوە ى(23) ساڵدا ،وەك خواى گەورەدەفەرموێت : ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر واتە:ئێمە قورئانمان پەیتا پەیتا دابەزاندووە و هەرخۆشمان دەیپارێزین .[17]

[17] - المرشدالوجیز (1/9-26) البرهان(1/228-232)،دراسات (24-27) ، فضائل القران(71-74)

## نیگا :

نیگا(وحی) له زمانه‌وانیدا (ئامارژه‌ی خێرا )ده‌گه‌یه‌نێت .

لــه زاراوه‌دا : دابــه‌زینی وتــه‌ی خوایــه بــۆ ســه‌ر پێغه‌مبــه‌رێك لــه پێغه‌مبه‌رانی .[15]

## جۆره كانی نیگا

1. بینینی خه‌ونی ڕاست و هاتنه‌دی خه‌ونه‌كان .
2. هاتنی فریشته له كاتی بێداریدا و به بێ ئه‌وه‌ی ببینرێت .
3. هاتنی فریشته له سه‌ر شێوه‌ی مرۆڤێكی ئاسایی .
4. هاتنی فریشته له سه‌ر شێوه‌ی خۆی .
5. نیگا كردن له سه‌ر شێوه‌ی ئیلهام خستنه ناو دڵه‌وه .
6. هاتنی فریشته به ڕاسته و خۆ و به بێ په رده.
7. هاتنی نیگا له پشتی په رده وه.[16]

---

[15] - مباحث (29) .

[16] - علوم القران الكريم (21-22) .

## قۆناغه كانى دابەزينى قورئان

خواى گەورە بە سىٰ قۆناغ قورئانى دابەزاندووە كە ئەمانەن :

1. لە لايەن زاتى خواى گەورەوە بۆ تە ختى پارێزراو (لوح المحفوظ ) وەك خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ البروج واتە: بەڵكو ئەوە قورئانێكى بەرز و بەرێزە و لە(لوح المحفوظ ) دايە .

2. لە (لوح المحفوظ ) ەوە بۆ ئاسمانى دونيا لە مانگى ڕەمەزاندا ، وەك خواى گەورەدەفە رمویٰ:

﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقـــرة

واتە: مانگى ڕەمەزان ئە و مانگە يە كە قورئانى تيا دابەزيوە.

3. لە ئاسمانى دنياوە بۆ سەر زەوى لە ماوە ى(23) ساڵدا ،وەك خواى گەورەدەفەرموێت : ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر واتە:ئێمە قورئانمان پەيتا پەيتا دابەزاندووە و هەرخۆشمان دەيپارێزين .[17]

[17] - المرشدالوجيز (1/9-26) البرهان(1/228-232)،دراسات (24-27) ، فضائل القران(71-74)

## حیکمەتەکانی دابەزینی قورئان بە جیا جیا

حیکمـەتی یەکـەم: چەسـپاند ن و جێگیربـونی دڵـی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) .

حیکمەتی دووەم: تەحەدا کردن و ئیعجاز بونی قورئان .

حیکمەتی سێیەم: ئاسانکاری بۆ لە بەر کردن و تێگەیشتن.

حیکمەتی چوارەم: پلە بەندی لە یاسادانانداابۆ پەروەردە کردن.

حیکمـەتی پێنجـەم: بەڵگەی بەهێز بۆ ئەوەی قورئان لـە لایـەن خواوەیە.[18]

### ئایەتی مەککی و مەدەنی

مەبەسـت لـە ئایـەتی مـەککی ئـەو ئایەتانـەن لـە پـێش کۆچـی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ شاری مەدینە دابەزیون ،
ئایــەتی مــەدەنیش ئــەو ئایەتانــەن لــە دوای کــۆچ بــۆ مەدینــە دابەزیون .

ســەرجەم ســورەتە مــەککی یــەکان (82) ســورەتە و، ســورەتە مەدەنی یـەکانیش (20) سورەتە، ئەوانـەی تـر ڕاجیـایی تیایـە

[18] – علوم القران الكريم (92-97) .

:به ڕاستی شاره زا بون له م زانسته په یوه ندی به شاره زابون
له ژیاننامه ی پێغه مبه ره وه (صلی الله علیه وسلم) هه یه ،له
به ر ئه وه ی قورئان شان به شانی بانگه وازی ئیسلامی داده
به زی بۆ ئه وه ی پیشانی پێغه مبه ر(صلی الله علیه وسلم)
بدات چۆن بانگی خه ڵکی ده کات بۆ لای ئاینی خواو،چۆن
مامه ڵه ده کات له هه موو بواره کانداو،چۆن وه ڵامی بێباوه
ڕان ده داته وه. هەر یەك لە سورەتە مەككی و مەدەنیەكانیش
خاڵی جیاكەرەوە و نیشانەی تایبەت بە خۆیان هەیە كە
ئەمانەن .[19]

سورەتە مەككی یەكان

1 . هەر سورەتێك باسی بیر و باوەڕ بكات مەككی یە .

2 . هەر سورەتێك وشەی (كلا ) ی تیا بێ مەككی یە .

3 . هەر سورەتێك ئایەتی كڕنوشی تیا بێ مەككی یە جگە لە سورەتی (الحج ).

4. هەر سورە تێك چیرۆكی ئادەم و ئیبلیسی تیابێ مەككی یە جگە لە سورەتی (البقرة ).

[19] -- المصدرالسابق (112) .

5. هەر سورەتێك چیرۆكی پێغەمبەران و نەتەوەكانی پێشینی تیابێ مەككی یە .

6. هەر سورەتێك بە پیتە پچڕ پچڕەكان دەست پێ بكات مەككی یە جگە لە سورەتی (البقرة ) و (ال عمران ) ،سورە تی (الرعد) یش ڕاجیایی تیایە .

7. هەر سورەتێك (يَا أَيُّهَا النَّاسُ) ی تیا بێ و (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا) ی تیا نەبێ مەككی یە[20]

---

**سورەتە مەدەنی یەكان**

1. هەر سورەتێك باسی ئە حكامی شە رعی بكات مەدەنی یە .

2. هەرسورەتێك باسی دوو ڕووانی تیابێ مەدەنی یە جگە لە سورەتی (العنكبوت ).

3. هەر سورەتێك بانگەوازی گاور و جولەكە بكات مەدەنی یە .

4. هەر سورەتێك (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا) ی تیابێ و (يَا أَيُّهَا النَّاسُ) ی تیا نەبێ مەدەنی یە .

5. هەرسورەتێك باسی بنچینە كانی ڕە وشت بكات مەدەنی یە 21.

---

[20] – البرهان (1/189-192) .

## هۆی دابەزینی ئایەتەکان

بریتی یە لە هە ر وتە یە ك یان کردە وە یە ك یان پرسیارێکی ئە وانە ی لە کاتی دابەزینی قورئاندا ژیاون قورئانیش بە هۆیە وە دابە زیوە ،بە م شێوە یە:

1. ڕووداوێك ڕوویداوە و ئایەت لە بارەیەوە دابەزیوە .
2. پرسیارێك لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کراوە و ئایەت لە بارەیەوە دابەزیوە،پرسیارەکانیش سێ شێوەی هەیە:

1. پرسیار بووە لە ڕوداوێکی ڕابردوو وەك پرسیار کردن لە ئەسکەندەر (ذو القرنين).
2. پرسیار بووە لە ڕووداوێکی دا هاتوو وەك پرسیار کردن لە قیامەت .
3. پرسیار بووە لە شتێکی ئێستا وەك پرسیار کردن لە ڕوح [22]
.

## سودەکانی هۆی دابەزینی ئایەتەکان

---

[21] علوم القران الكريم (116-122) .

[22] المصدر السابق، نفس الصفحة .

1. يارمەتيدەرە بۆ تێگەيشتن لە ماناى مەبەست .

2. زانينى لايەنى حيكمەتى ئەو شتەى ياساى حوكمەكەى لە خۆ گرتووە .

3. نەهێشتنى ئالۆزى لە ڕووى دەقەكە وە بۆ كە سێك هۆى دابە زينى ئايەت نە زانێت .

4. دەرخستنى نهێنى يەكانى ڕەوانبێژى لە قورئاندا .

5. ئاسانكارى بۆ لە بەركردنى ئايەتەكان .

6. جوان پەروەردەكردنى موسڵمانان .[23]

## ڕێگاكانى هۆى ناسينى دابەزينى ئايەتەكان

---

[23] - مناهل العرفان (1/78-80)، البرهان (1/21-23) .

زانینی هۆی دابەزینی ئایەت (أسباب النزول ) بە بۆچون و ئیجتیهاد نابیٚ مەگەر بە ڕیوایەت و بیستن،ڕیٚگاکانیش ئەمانەن:

**ڕیٚگە ی یەکەم:** لاوازی گیٚڕە رەوەکان :لاوازی گیٚڕەرەوە ئەبیٚتە هۆی هەڵە کردن لە گیٚڕانەوەکەدا و وەرناگیریٚ،

خۆ ئەگەر پیٚچەوانەی گیٚڕانەوەیەکی بە هیٚزتر بوو ئەوا ئەوەی یەکەم لە پیٚشترە بۆ وەرنەگرتن بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرمویٚت :﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ ﴾

وا چەسپاوە کە ئەم ئایەتە لەبارەی نویٚژی سوننەتی موسافیریٚکەوە دابەزیوە کە بە سەر وڵاخەکەیەوە ئەنجامی بدات هەر وەك لە صحیحی موسلیمدا هاتووە،پیٚشەوا ترمذیش دەگیٚڕیٚتەوەئەم ئایەتە لەبارەی کە سیٚکەوە دابەزیوە کەنەزانیٚت ڕووگە(قبلە) کەوتۆتە کویٚوە،بەڵام گیٚڕانەوەی یەکەم بەهیٚزترە.

**ڕیٚگەی دووەم:** چەند هۆیەك بۆ یەك ئایەت،وە ك ئایەتی(لعان)،پیٚشەوا بوخاری دەڵیٚ:لە بارەی هیلالی کوڕی ئومەییەوە دابەزیوە ،دەڵیٚ لە کاتیٚکدا ژنەکەی تۆمەتبار کرد لای پیٚغەمبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) بە شەریکی کوڕی

سه محاء، هه روه هاعومەیر ئه چێت پرسیار ده کات له پێغه مبه ر (صلى الله عليه وسلم)له باره ی پیاوو ژنێکه وه که زینا ده که ن پاشان ئایه تی (24)ی سوره تی ( نور ) داده به زێت، پیغـه مبـه ریـش(صـلى اللـه عليـه وسـلم) ده فـه رمـویّ:

(قدانزل الله القران فيك وفي صاحبتك) [24]

واته:ئایەت له بارەی خۆت وهاوەڵەکەته وه دابەزی.

رێگەی سێیه م:یه ك ئایه ت بۆ چه ند هۆیـه ك: عـه بوللّـای کوری مـه سـعود.[25] لـەباره ی ئایـه تـی ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴾ الإسراء ه وه ده ڵێت: ئـه م ئایـه تـه لـه کاتێکدا دابـه زی کـه پێغـه مبـه ر(صلى الله عليه وسلم)له شاری مـه دینـه دابوو جوله کـه کـان پرسیاریان لێکرد لـه باره ی ڕوحـه وه،هاوبـه ش پـه یدا کـه ران پێش ئه وان له شاری مه ککه پرسیاریان لێکردبوو.[26]

## قۆناغه کانی کۆکردنەوە و نوسینەوەی قورئان

---

[24] - البخاري (6/99و100)،ومسلم(4/205) .

[25] - البخاري (6/108-109)،ومسلم(8/128)،والترمذي(3141)، والنسائي(319) .

[26] - علوم القران الكريم (106-108) .

قورئـانی پـیرۆز لـه سـێ سـەردەمی جیاجیـادا کۆکراوەتـەوە و نوسراوەتەوە،سـەردەمی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) و سەردەمی خەلافەتی ئەبو بەکر و سـەردەمی خەلافـەتی عوسمـان (خوا لێیان ڕازی بێت).

یەکەم: سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چەند نوسەرێکی نیگای هەبوو هەرکاتێ ئایەت دادەبەزی فەرمانی پـێ دەکـردن بینوسـنەوە لـه سـەر پەلکـه خورمـا و پێسـت و ئێسـك و بـەردی تـه نـك ،ئـیبن عەباس دەگێڕێتەوە :هەر کاتێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سـورەتێکی بـۆ دادەبـەزی نوسـەرەکانی بـانگ دەکـرد و دەیفـەرموو: (ضـعواهذه السـورة في الموضـع الـذي يذكرفيـه كـذا وكـذا) واتـه: ئـەم سـورەته لـه وشـوێنەدابنێن کـه باسـی ئـەوە و ئـەوەی تیایه،ئـەم جـۆره دانـان و ڕێکخسـتنەی ئایەتـەکان و سـورەتەکان کـه ئێسـتا هەیـه بـه فـەرمانی پێغەمبـەر (صـلی الله علیه وسلم) بوە و ئەویش جبریل (علیەالسلام) پێی ڕاگەیاندووە و گومـانی تیانیـه کـه جـبریلیش خـوای گـەورە فـەرمانی پـێ کردووە،نوسـەرەکانیش کـه پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) هەڵبـژاردبوون بـۆ ئـەو ئەرکـه لـه چـاکترینی نـاو هـاوەڵان بـوون لەوانـەش :ئەبوبـەکر ،عومـەر ،عوسمـان ،عـەلی ،معاویـه ،ئـەبانی

کوڕی سەعید ،خالیدی کوڕی وەلید ،ئوبەی کوڕی کەعب ،زەیدی کوڕی ثابت ،هتد کەواتە لە سەردەمی پێغەمبەر دا (صلی الله علیە وسلم) هەموو قورئان نوسراوەتەوە بە و شێوەیەی کە باسکراو هەر حەوت جۆرە خوێندنەوەکەشی لە خۆ گرتبوو .[27]

## دووەم: سەردەمی ئەبوبەکر

لە دوای بوون بە خەلیفە ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێ ) چەندین ناخۆشی ڕوو بە ڕووی دەسەلاتەکەی بۆوە .لەوانە شەڕی یەمامە لە سالی 12 ی کۆچیدا بە سەرکردایەتی موسەیلەمەی درۆزن کە هاوەلانێکی زۆر تیایدا شەهید بوون لەوانەی هەموو قورئانیان لە بەر بوو کە ژمارەیان گەیشتە (70) شەهید، لە گەورەترینیشیان سالمی خزمەتکاری ئەبو حوزەیفە .عومە ری کوڕی خە طاب چووە لای ئەبوبەکر و پێشنیاری کۆکردنەوەی قورئانی بۆ کرد لە ترسی فەوتان و تیا چونی ئەبوبەکریش (خوا لێی ڕازی بێ) سەرەتا دوو دل بوو،ئەترسا نەوەك ڕێخۆشکەر بێت بۆ داهێنان و بیدعە چونکە کارێك بوو پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) نەیکردبوو،عومەر قەناعەتی بە

---

[27] – الاتقان (57/1) .

ئەبوبەکر کرد (خوا لە هەردوکیان ڕازی بێ) ،ئەبو بەکر زەیدی کوڕی ثابتی بانگ کرد زەیدیش لە سەرەتادا دوو دڵ بوو لە ئە نجامدانی کارەکە و وتی:سوێند بە خوا کێویێکم پێ بگوازنەوە لام ئاسانترە لە ئەنجامدانی ئەم کارە ،زەید دەڵێ:ئەبوبەکر ئەوەندە سور بوو لە سەر بیرۆکەکەی تائەوە بوو قەناعەتی پێ کردم نەترسم،ئەبو بەکر لەم کارەیدا زۆر وردبین بوو بۆ کۆکردنەوەکەش پشتی بە دوو سەرچاوە بەست،یەکەمیان: ئەوقورئانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) بوو،دووەمیان پشت بەستن بەو هاوەڵانەی قورئانیان لە بەر بوو کە دەبوایە دوو کەس شایەدی بۆ بدایە ئینجا شایەدی لێوەردەگیرا کەواتە ئەبوبەکر یەکەم کەس بووە قورئانی کۆکردەوە.[28]

**سێیەم: سە ردە می عوسمانی کوری عە ففان**

لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففاندا (خوا لێی ڕازی بێ ) فتوحاتی ئیسلامی زۆر بوو موسڵمانان بە سەر چەند هەرێم و ناوچەیەکدا دابەشبون هەر ناوچە و شێوە قورئان خوێندنی هاوەڵێکی وەر گرتبوو کە ئەو هاوەڵانەش لە

---

[28] - تفسير القرطبي(1/41-49)،البرهان(1/238-239)،المرشدالوجيز(1/48-49)،القران وعلومه(19-20)،مصاحف ابن ابي داود(48-57)،تنبيه الخلان(473-474 ) .

پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) وەریان گرتبوو ،خەڵکی هەر ناوچە و خوێندنەوەی خۆی بە ڕاست و تەواو دەزانی ،کێشەو ناکۆکی زۆر و گەورە دروستبوو بە شێوەیەك کار گەیشتە ئەو ئاستەی یەکتریان کافر دەکرد و خەریك بوو لە یەکتر بکوژن ،بە هۆی ئەوەوە پێشەوا عوسمانی کوڕی عەففان بە سەلیقە و وردبینی خۆی بیری لە چارەسەرێك کردەوە بۆ ئەو قەیرانەی کە موسڵمانانی تێکەوتووە.کە ئەویش بریتی بوو لە کۆکردنەوەی خەڵکی لە سەر یەك شێواز قورئان خوێندن بۆیە فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی ثابت و عەبدوڵلای کوڕی زوبێر و سەعیدی کوڕی عاص و عبدالرحمانی کوڕی حارثی کوڕی هیشام کە قورئانی هەموو شوێنەکان بەوەی لای خاتو حەفصەشەوە کۆبکەنەوە و بۆی بێنن ئەم لیژنە چوار کەسی یە دەستیان کرد بە نوسینەوەی قورئان هەر ئایەتێك پێش ئەوەی بینوسنەوە پیشانی هاوەڵە گەورەو ناودارەکانیان دەدا و دڵنیا دەبون کە قورئانە ئینجا دەیاننوسیەوە ،عوسمان ( ڕەزای خوای لێ بێ ) فەرمانی کرد ئەو ئایەتانە بنوسرێتەوە کە متەواتیر بون و ،بە شێوەیەکیش بوو کە هەر حەوت جۆرە خوێندنەوەکەی لە خۆ گرتبوو بە بێ دانانی خاڵ و شێوە (نقطة وشكل )، هەر وەها هەموو ئەو شتانەی لێ جیا کردەوە کە هەندێ لە هاوەڵان تایبەت بە خۆیان وەك ڕاڤەی هەندێ ئایەت نوسیبویان

،شێوازی ڕێکخستنی سورەت و ئایەتەکانیش بە و شێوەیە بوو کە ئێستا هەیە پاشان فەرمانی کرد هەر قورئانە و بۆ هەرێم و ناوچەیەك بنێردرێت و پێچەوانەکانیان بسوتێنرێن .زانایان ڕاجیاوازن لە سەر ژمارەی ئەو قورئانانەی کە عوسمان ناردی بۆ ناوچە و هەرێمەکان .

أ. هەندێك دەڵێن : ژمارەیان حەوت قورئان بووە .

ب. هەندێکی تر دەڵێن: ژمارەیان چوار قورئان بووە .

ج. هەندێکی تر دەڵێن:ژمارەیان پێنج قورئان بووە . ئەو قورئانەش کە لای خاتوو حەفصە بوو ناردیەوە بۆی تامردیش هەر لای مابوو پاشان شۆردرایەوە .دەڵێن:مەڕوانی کوڕی حەکەم بردویەتی یە لای خۆی سوتاندویەتی.[29]

**چاککردنی ڕەسمی عوسمانی**

قورئانەکانی سەردەمی عوسمان خاڵ و شێوەکاری نەبوو،چونکە عەرەب بە سەلیقەی خۆیان پێویستیان بەوە نەبوو، بەلاّم کە عەرەب تێکەڵ بون بە نەتەوەکانی تر ،ڕەسمی عوسمانی پێویستی بە چاك کردن کرد بۆ ئەوەی موسڵمانان بە گشتی لێی سوودمەندبن تا یارمەتیدەر بێ لە سەر چاك

---

[29] – البرهان (1/235-26) ، الاتقان(1/60) ،مناهل العرفان (1/278) ، القران وعلومه (20-22) ، تنبيه الخلان (474-475) ،مصاحف ابن ابي داود (66-138) .

خوێندنەوەی زانایان ڕا جیاوازن لە سەر ئەوەی کە یەکەم کەس کێ بووە خاڵ و شێوەکاری بۆ قورئان کردووە زۆر لە زانایان دەڵێن: یەکەم کەس کە خاڵ و شێوەکاری بۆ قورئان دانا ئەبو ئەسوەدی دوئەلی بوو بە فەرمانی عەلی کوڕی ئەبو طالیب بە هۆی ئەوەی جارێك گوێی دەبێت لە کەسێك ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ ۝٣﴾ کە وشەی (وَرَسُولُهُ) ی بە مەجروری خوێندەوە، ئەبو ئەسوەد ڕاچەڵەکی و وتی: خوا گەورەیە لەوەی لە پێغەمبەرەکەی بەری بێت !پاشان ڕۆی بۆلای زیاد لە بەصرە و پێی وت: وەڵامی داواکەتم دایەوە ،زیاد داوای لێ کرد چەند نیشانەیەك بۆ قورئان دابنێت خاوی تیا نواند سەرەتا ترسا لە هەڵوێستەکەی، لەم کارەدا بە جدی داواکەی بە هەند گرت و هەڵەکەی بووە هۆی ئەوەی کە نیشانە دابنێ بەم شێوەیە،فەتحە لە سەرەوە و کەسرە لە ژێرەوەو نیشانە ی ضە ممە خاڵێك لە ناوەڕاستدا و، نیشانەی سکونیش دوو خاڵ ،پێشەوا (سیوطی ) ش دەڵێ:یەکەم کەس هەستا بەو کارە ئەبو ئەسوەدی دوئەلی بوو بە فەرمانی (عبدالملك )ی کوڕی (مەڕوان) نەك بە فەرمانی (زیاد ) چەند زانایەکی تریش ئەم کارە ئەدەنە پاڵ کەسانی تر لەوانە:حەسەنی بەصری و،یەحیای کوڕی یەعمەر و نەصری کوڕی عاصم،بەڵام بە ناو بانگترینیان ئەبوئەسوەدە، ئەوە بوو

ورده ورده به مێـژوودا هـات هـەر سـەردەمەو جۆره خزمـەتێکی قورئان دەکرا له بواری خاڵ و شێوەکاریدا پاشان لـه سـەردەمی سێیەمی کۆچیدا ڕەسمی عوسمانی به تەواوی چاك کراو خـەڵك پێشـبڕکێیان دەکـرد لـه هەڵبـژاردنی خـەتی جـوان و داهێنـان ونیشانه بۆی.[30]

دابەزینی قورئان لەسەر حەوت پیت

پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسـلم) لەچـەندین فـەرموودەدا ئامـاژه بـۆ ئـەوه دەکـات کـه قورئـان لـه سـەر حـەوت پیـت دابەزیوه ئـەو هاوەڵانەشـی کـه فـەرمودەکانی ئـەو باسـه دەگێڕنـەوه ژمارەیـان (21) هاوەڵه و ژمارەیان گەیشتۆته ئاسـتی متـەواتیر، پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسـلم) ده فـه رمویَـت (إنَ هـذا القـران انـزل علـی سبعة احرف فأقرأواماتَیسرَ منه )[31]

واته:بەڕاستی ئەم قورئانه له سەر حەوت پیـت دابـەزیوه کامیـان ئاسانه بەو شێوەیه بیخوێنن.

ڕاجیایی یەکی زۆر له نێوان زانایاندا له سەر واتـای ئـەو حـەوت پیته هەیه به شێوەیەك که (إبن حبان) دەفـەرموێت (35) قسـەی له سەره ، بەڵام زۆرێـك لـه زانایـان ئـەو بۆچـونەیان هەڵبـژاردووه که دەڵێت: مەبەست لـه واتـای حـەوت پیـت حـەوت لەهجەیه لـه

---

[30] - الاتقان (2/290-291) ، مباحث (134-135) .

[31] - البخاري (6/100) ، ومسلم (2/202)،ابوداود (2/101) ،الترمذي (11/61) .

لەهجەی هۆزەكانی ناو هۆزی قورەیش لە نیوە دوورگەی عەرەبدا چونكە لە سەردەمی نەفامی (جاهلی ) دا پێكهاتەیەكەی دابڕێنراو و تێكەڵ بە هۆزەكانی تر هەبوو،هێرشی هۆزەكانیش لەو سەردەمەدا بۆ سەر یەكتر كە چەندینیان لە یەكتر كوشت باوبوو لە پێش ئیسلامدا هۆزەكان كە دەهاتن بۆ حەج پەیوەندی بازرگانی لە نێوانیاندا هەبوو هەر كەسێك لە و سەردەمەدا لە كاتی قسەكردندا دەیویست گوێگر بە قسەكانی سەرسام بێت،زمانی نمونەیی و ستانداریش لە مەككەدا زمانی هۆنراوە و ڕەوانبێژی بوو،كاتێ كە ئیسلام هات ویستی دڵی خەڵكی ئەو ناوچەیە پێكەوە گرێ بدات ،بۆیە خوای گەورە قورئانی بە هەندێ لە و لەهجانە دابەزاند لە گەڵ ئەوەشدا بە لەهجەی گشتی (زمانی ستاندار ) دابەزی بۆ كار ئاسانی بۆیان و تا دڵیان بكات بەیەك ئەمەیە مەبەستی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم) كە دەفەرموێت (أنزل القران على سبعة أحرف فاقرؤا ماتيسر منه) [32]

[32] – تفسيرالقرطبي(1/41-49)،فنون الافنان(1/214-219)،المرشدالوجيز(1/77-202)،الانتصار(367-385)،علوم القران للصف الرابع،عادل كمال(99-100) .

## حەوت جۆر خوێندنەوەکەی قورئان

حەوت جۆر قورئان خوێندنەوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) کە حەوت لە هاوەڵان دەیگێڕنەوە حەوت هاوەڵەکەش ئەمانەن: (عوسمان ، عەلی ،ئوبەی ،زە یدی کوڕی ثابت ،ئیبن مەسعود ، ئەبو موسای ئەشعەری ،ئەبو دە رداء ).خوێندنەوەی ئەم حەوتە تەواومتەواتیرە جگە لەم حەوتە سێ جۆری تر خوێندنەوەی ئاحادیش هەیە،هەرخوێندنەوەیەکی تر کە هەیە شازە وەك خوێندنەوەی یەزید و حەسەن و ئەعمەش و ئیبن جوبەیر و هتد.....

لە حەوت جۆرە متەواتیرەکە کە چەندین هاوەڵ و تابعی لەوانەوە وەریانگرتووە،لە هەموو ناوچەو ولأتاندا کە دواتر بوون بە حەوت قوتابخانە (مدرسە ) ی بە ناوبانگ ،کە ئەمانەن: قوتابخانەی ئەبو عەمر لە (کوفە ) و ،قوتابخانەی نافع لە (مەدینە ) و ،قوتابخانەی عاصم لە (کوفە ) و، قوتابخانەی حەمزە لە (کوفە ) و، قوتابخانەی کەسائی لە (کوفە ) و ،قوتابخانەی ئیبن عامر لە (شام ) و، قوتابخانەی (ئیبن کثیر) لە ( مەککە).زانایان بۆ کار کردن بەم حەوت جۆرە ئە م سێ مە رجە یان داناوە:موافقی زمانی عەرەبی بێت,موافقی ڕەسمی عوسمانی بێت,سەنەدەکەی دروست(صحيح)بێت

هەندێ لە زانایان جۆری خوێندنەوەکانی قورئانیان کردووە بە شەش جۆرەوە کە ئەمانەن :متەواتیر،مە شهور،ئامادە،شاز،هە ڵبە ستراو،مودرەج.

ئەم حەوت جۆرە خوێندنەوەیە ئەم سودانەی هەیە:

1. بەڵگەیە لە سەر پاراستنی قورئان لە لایەن خواوە .
2. سوککردن و ئاسانکاری بۆ خوێندنەوە .
3. دەرخستنی ئیعجازی قورئان لە کورتیییەکەیدا .
4. ڕوونکردنەوەی ئەو ئایەتانەی کە بە جۆرەخوێندنەوەیەکی ترمانایەکی تر دەگەیەنێ .[33]

---

[33] - مباحث في علوم القران (156-161) ، السبعة في القراءات (113-125) .

## ئیعجازی قورئان

موعجیزاتی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لە سەر بێ) تایبەت بوو بە سەردەمی خۆیانەوە تەنها نەتەوەکانی خۆیان و خەڵکی ئەو سەردەمە دەیان بینی لە ناو سەرجەم پێغەمبەرانیشدا کۆتا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چەندین موعجیزەی هەبووە بەڵام لە هەموو موعجیزەکانی گەورەتر کە بەردەوام تا ڕۆژی قیامەت دەمێنێت و تەحەدای هەموو ڕەوانبێژی عەرەبی کرد قورئانە، تەنانەت بۆ هەتا هەتایە بانگ لە هەموو مرۆڤێك دەکات لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا لەوەی کە بتوانن وەك ئەو بێنن نەك هەر مرۆڤ بە تەنها بەڵکو با پەری (جنۆکە ) شی لە گەڵ بێت و پشتیوانی بێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ الإسراء

واتە: بڵێ ئەگەر هەموو مرۆڤ و پەری کۆببنەوە لەوەی وەك نمونەی قورئان بێنن ناتوانن وەك ئەو بێنن ئەگەر چی پشتیوانی یەکتریش بن ،نەك هەر وەك قورئان بەڵکو تە حەدایان دەکات بتوانن وەك سورەتێکی قورئانیش بێنن وەك دەفەرموێت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم

﴿ مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ واته:یان دەڵێن ئەم قورئانە خۆی هەڵیبەستووە تۆ پێیان بڵێ دە بتوانن وەك یەك سورەتێکی قورئان بێنن کێی هەتانەو لە توانانادایە جگە لە خوا بانگی بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن .

دۆست و دوژمن لە کۆن و نوێدا شایەدی بۆ گەورەیی قورئان دەدەن ،چەندین زانا و دانا و ڕەوانبێژ بە هۆی ئایەتێکەوە یان گوێگرتن لە قورئان موسڵمان بوون .

**لە ئیعجازەکانی قورئانیش**

1 . جوان دانانی وشەکانی و ڕەوانبێژییەکەی .

2 . وێنە ڕێکخستنێکی سەیر و سەرسوڕهێنەرەکانی .

3 . لە خۆگرتنی هەواڵی غەیبی و نادیار .

4 . هەواڵی ئوممەتانی ڕابردوو کە تیا چونە .

5 . بێزار نەبونی خوێنەر و بیسەر لێی .

6 . کۆکردنەوەی سەرجەم زانستەکان لەخۆیدا بە کورتی .

7 . پاراستنی لە لایەن خواوە لە دەستکاری کردن .

8 . ترس و سام دروستبون لە کاتی خوێندنەوە و بیستنی دا.

9. لە خۆگرتنی پێویستییە کانی مرۆڤ.

10.نە توانینی پێغە مبە ر(صلی الله علیه وسلم) لە گۆڕینی ئایــــــــــــــــــــــــــە ت.[34]

---

[34] - مناهل العرفان (2/239-295) .

## نمونەکانی قورئان

خوای گەورە بۆ تێگەیشتن لە پەیامەکەی خۆی بۆ چەندین باس و خواسی گرنگ نمونەی هێناوەتەوە کە زیاتر لە چل نمونەیە،بۆ ئەوەی مێشکی مرۆڤ بکاتەوە و ئەو عەقڵ و ژیرییەی کە خوا پێی داوە بە کاری بهێنێت وەك دەفەرموێت:

﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الحشر واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایەتە سەر کێوێك و (تێگەیشتن و ژیریمان بدایە پێی )ئەتبینی ئەو کێوە ملکەچ و پارچە پارچە دەبوو لە ترسی خوا،ئەم نمونانە بۆ خەڵك دێنینەوەبۆ ئەوەی بیربکەنەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ العنكبوت

واتە:ئەم نمونانە بۆ خەڵکی دێنینەوە کەس پەندی لێ وەرناگرێت مەگەر ئەو ژیرانەی ورد دەبنەوە .

**جۆرەی نمونەکان:**

1 . **نمونە ئاشکراکان** . 2. **نمونە شاراوەکان** . 3. **نمونە ڕەهاکان**

1. **نمونە ئاشکراکان :** ئەوەیە بە ئاشکرا وشەی نمونەی تیایە یان شتێکی تیایە بەڵگەیە لە سەر لێکچواندن وەك خوای گەورە لە بارەی دوو ڕووەکانەوە دەفەرموێت : ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا ﴿١٧﴾﴾ البقرة . لەم ئایەتەدا خوای گەورە نمونەی دوو ڕووەکانی بە کەسێك چواندوە کە ئاگرێك دەکاتەوە بۆ ڕوناکی و خۆ گەرم کردنەوە بە لاّم ئاگرە کە یان دە کوژێتەوە ،ئەوانیش مادییەن بە هاتنە ناو ئیسلامەوە سودمەند بونە بەلاّم هیچ شوێنەوارێکی ڕۆشنی لە دڵیاندا دروست نەکردووە.

---

2. **نمونە شاراوەکان :** ئەوەیە بە ئاشکرا نمونەی تیا نیە بەلاّم مانای جوان لە ئیعجاز دەبەخشێت وەك لە مانای ئەو پەندەی کە دەڵێ:چاکترین کار مامناوەندییەکەیەتی (خير الامور اوسطها)دا هاتووە،وەك خوای گەورە لە بارەی مانگاکەی بەنی ئیسرائیلییەکانەوە دەفەرموێت: ﴿لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴿٦٨﴾﴾البقره

واتە: مانگایەکە نە زۆر پیرە و نە زۆر گەنجە بەڵکو تەمەنی لەو نێوانەدایە.

3. **نمونــه ڕەهاكــان : ئـەو ڕسـتانەیە كـە بـێ كـۆت و بەنـدن و بـە ئاشـكرا وشـەی لێكچـواندنی تیـا نیـە بـەلاّم وەك نمونـە وان ،بـۆ نمونـــە خـــوای گـــەورە دە فـــەرموێت ﴿ ٱلۡـَٔـٰنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ ﴿٥١﴾ ﴾**

**واتــە: ئێسـتا ڕاسـتی دەركـەوت یـان دەفـەرموێت: ﴿ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾**

**واتە:هەر كۆمەڵێك دڵخۆشە بەو بەرنامەیەی كە لە سەریەتی .**

**زانایان بۆچونیان جیاوازە لە م نمونـە یـە دا كـە پێـی دە وترێـت نمونە ی ڕە ها(ارسال المثل)كە ئایا حوكمی بە كارهێنـانی وەك نمونەچۆنە؟**

**هەنـدێك لـە زانایـان وایـدە بیـنن دروسـت نییـە وە ك نمونـە بـە كاربهێنرێن.**

**هە ندێكی تر وایدە بینن كە دروستە.**[35]

**سودی نمونەكانی قورئان**

1. **نمونە زیاتر و خێرا تر لە مێشكدا دەچەسپێت .**
2. **نمونە شتی نا ئامادە بە ئامادە پیشان دەدات .**
3. **نمونە هاندەرە بۆ ئـەوەی مرۆڤ خـۆی بـە نمونـە پـێ هێنـراو بچوێنێت ئەگەر سەرنج ڕاكێش بێت**

[35] - البرهان (486/1) مباحث (261-262) .

4. نمونه جارهەیه وەسف وستایشی تیایه بۆ نمونه پێهێنراو.
5. نمونه جار هەیه ئەگەر نمونەپێهێنراو سەرزەنشت کراو بوو مرۆڤ لێی دور بکەوێتەوه .
6. نمونەکاریگەر تره له ئامۆژگاری و ترساندن.[36]

## سوێند له قورئاندا

خوو و عاده تی عه ره ب وایه که سوێند به کارده هێنێت له کاتی جه ختکردن له سه ر شتێك ،قورئانی پیرۆزیش به زمانی عه ره ب دا به زیوه ،ئایه ته پیرۆزه کانیش چه ندین جۆر سوێندو هونه ری داهێنانکارانه ی به کار هێناوه بۆ جه ختکردن له سه ر شتێك ،مه به ست له سوێند به کار هێنانیش چه سپاندنی بانگه شه نییه ،چونکه بانگه شه کان به ڵگه ی براوه(قطعي)خۆی هه یه که ده یچه سپێنێت ،به ڵکو سوێند بۆ ئاوڕدانه وه یه بەلای گرنگی باسه که دا،ئامادەیی وەرگرتنی قسه له لایەن دوێنراوەوه به پێی ئاست و جۆری کەسەکان جیاوازه،ئەو دەروونەی که پاکه و تێکەڵ به پیسی تاوان و گوناه نەبووه ئامادەیی تەواوی تیایه بۆ وەرگرتنی قسەی هەق بەلام دەروونێك که پیس بوبێ به چڵکی گوناهو تاوان درەنگتر

---

[36] البرهان (1/487-488) مباحث (263-264) .

هـەق وەردەگرێـت ،یـان هـەر وەریناگرێـت کۆمەڵگـەی نیـوە دورگـەی عـەرەبیش لـە پـێش هـاتنی ئیسـلامدا هەرچـەند لـە کۆمەڵگـەکانی تـری ئـەو سـەردەمەش باشـتر و پـاکتر بـوو بـەڵام نوقمی زەلکاوی تاوان و نەفامی بوو،بۆیەش ئایەتەکانی قورئان کـە ڕاسـتەوخۆ بـۆ ئـەو کۆمەڵگەیـە ئاڕاسـتەکراوە ئاسـایی یـە پڕبێـت لـە سـوێند بە کارهێنـانی خـوای گـەورە بـۆ خـەڵکی ئـەو سـەردەمە، زۆری سـوێندەکانیش بەرامبـەرە بـە ملکـەچ نـەبون و ئینکـاری و عینـادی ئـەو خەڵکـە و مرۆڤـەکان بـە گشـتی،خوای گـەورە سـوێند دەخـوات بـە زاتـی پـیرۆزی خـۆی و سـیفەتە جوانـەکانی و هەنـدێ لـە دروسـتکراوەکانی کـە پـاك و پـیرۆزن ،بەڵام بۆ بەندەکانی نیـە سوێند بخۆن بە غـەیری خـوای گـەورە هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (من حلف بغير الله فقد كفراو اشرك )[37]

واتە:هەر کـەس سوێند بە غـەیری خـوا بخـوات ئـەوە کـافر بـووە یان هاوبەشی بۆ خوا بڕیارداوە.[38]

جۆرەکانی سوێند

سوێند دوو جۆری هەیە ئاشکرا یا نهێنی :

[37] - رواه الترمذي .

[38] - روائع البيان (474) .

1 . سوێندی ئاشکرا: ئەوەیە پیتەکانی سوێند تیایدا ئاشکرایە یـان وشـەی سـوێندی بـۆ بـەکار هـاتووە وەك پیتـە کـانی( واو و،باءو،تاء )،لە هە ندێ شوێندی قورئاندا وشه ی(لا)ی نه رێش بـە کـار هـاتووە کـە ئـە ویـش زیـاتر بـۆ جـە ختکردنـە وە ی سوێندبۆ بە کار هاتووە کە یە.

2. سـوێندی پـەنهان: ئەوەیـە پیتـەکانی سـوێند یـان وشـەی سـوێندی بـۆ بـە کـار نـەهاتووە بـە لاّم لامـی جـە ختکردنـە وە(تاکید)ی بۆ بە کار هاتووە ،وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ ﴿١٨٦﴾﴾ آل عمران

واتە: سوێند بە خوا تاقی دەکرێنەوە لە ماڵ و نەفستاندا.[39]

**حاڵەتەکانی سوێند بۆ بە کار هاتوو**

لە لایە نی ئە و شتانە ی کە سوێندیان بۆ بە کار هاتووە چوار حاڵە:

**1**. بنچینە کانی باوە ڕ، وە ك تاك وتە نهایی خوای گەو رە وە ك خوای گە ورە دە فە رموێت: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ﴿٤﴾﴾

---

[39] - مباحث في علوم القران (267-268) .

2. چه سپاندنی ئه وه ی كه قورئان هەق وڕاستە،وه ك خوای گـه وره ده فـه رموێـت: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ الواقعة

3. چه سپاندنی پێغه مبه رایه تی پێغـه مبه ر(صلى الله عليه وسلم) ، وه ك خـوای گـه وره ده فـه رموێـت: ﴿ يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ ﴾

4. نه ڕێ كردنی سیفه تێكی نه شیاووخراپ،وه ك خوای گه وره ده فه رموێت: ﴿ نٓ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ ﴾ القلم .[40]

## گفتو گۆ له قورئاندا

ئـەو ڕاسـتی یانـەی كـه مـرۆڤ هەسـتی پـێ دەكـات و بـه چـاو دەیبینێت پێویستی به بەڵگه هێنانـەوه نـی یه بۆ چەسپاندنی یان بۆ ڕاستێتی بەڵام خۆ به زلزانین زۆر جار وا له مـرۆڤ دەكات گومـان بوروژێنێـت و ناهـەقی بكـات بـه بـەری ڕاسـتی یەكانـدا قورئـانی پیرۆزیـش بانگـەوازه بـۆ سـەرجەم مرۆڤایـەتی و لـه بەردەم چەندین ململانێـی جیاجیادا وەستاوه كـه دەیانـەوێ بـه

---

[40] – روائع البيان (475) .

ناهەقی ئینکاری ڕاستی یەکانی قورئان بکەن، خوای گەورە باس لەوە دەکات کە دەمەقاڵێ سروشتی مرۆڤە هەروەك دەفەرمویێت: ﴿ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ٥٤ ﴾ الكهف

واتە:مرۆڤ لە هەموو شتێك زیاتر دەمەقاڵێ دەكات .

وە فەرمانیش بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەكات بە جوانترین شێوە دەمەقاڵێ و موجادە لە گەڵ بێ باوەڕاندا بكات هەر وەك دەفەرمویێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ١٢٥ ﴾ النحل

واتە: بانگەواز بۆ ئاینی خوا بكە بە دانایی و ئامۆژگاری چاك و جوان و بە جوانترین شێوەش دەمە قاڵەیان لە گەڵدا بكە .[41]

## جۆرەكانی گفتو گۆ و دەمەقاڵێ لە قورئاندا

خوای گەورە باسی بەڵگەكانی بونەوەر دەكات بە وورد بونەوە و بیركردنەوە لێی بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە بۆ بنەماكانی باوەڕ و( ئیمان) ئەم جۆرە زۆرە لە قورئاندا . لەوانە خوای گەورە دەفـــــەرمویێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ

[41] مباحث في علوم القرآن (273-274) ، البرهان (2/24-27) .

ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ

﴿٢٢﴾ ﴾ البقرة

واتـه:ئـهى خهڵكينـه ئـهو پـهروهردگارهتان بپهرستن كهئێوهش و ئهوانهى پێش ئێوهشى دروست كردووه بهڵكو به هۆى ئـهوهوه خۆتـان ئامـاده بكـهن بـۆ بـه گـهوره گـرتن وچاودێرى خـوا ،ئـهو زاتـهى كـه زهوى بـۆ ڕاخسـتون و ئاسمـانى بـۆ ڕاگرتـون و لـه ئاسمانـهوه بـارانى بـۆ باراندون كـه هۆيـه بـۆ ڕوانـدنى ڕووهك و ميـوه و ڕزق و ڕۆزى بۆتـان لـه گـهڵ هـهموو ئهمانـهدا ڕهواو و دروست نيه وا بزانن و بڕوا بكهن كه خوا هاوتـاى ههيـه و وهك خـوا بيـان پهرسـتن چـونكه خـوا هاوتـا و هاوبهشـى نيـه لـه حاڵهتێكدا كه ئێوه به فيتره تى پاكى خۆتان دهزانن خوا هاوتـا و هاوبهشى نيه ،جا كهوايه لانهدهن .

ب. وه لأمدانـه وه ى نـه يـارو نكوڵيكاران كـه ئـه مـه ش چـه نـد شێوه يه كى هه يه:

يـه كـهم: ددانپييانـانى دوێنـراو بـه شـێوازى پرسـياركردن، وهك خواى گهوره دهفهرموێت: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۣيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِۖ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ

ٱلْبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿٣٩﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ
يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هُمُ ٱلْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ ۚ سُبْحَٰنَ
ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ الطور

**واتە: ئایا ئەوان بە بێ دروستکار دروست بونە یان خۆیان خۆیان دروست کردوە؟ یان ئەوان ئاسمانەکان و زەوییان دروست کردووە؟ بەڵکو ئەوان بڕوا ناهێنن بەوەی کە پێویستە بۆ خوا بۆیە هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن،یان ئەبێت ئەوان گەنجینەکانی پەروەردگارتیان بە دەست بێ یان دەسەلاتیان هەیە چیان بوێ بڕیاری لە سەر دەدەن ؟یان ئایا پەیژەیان هەیە پێی سەردەکەون بۆ ئاسمان بە هۆیەوە گوێ لە بڕیارەکانی خوا دەگرن؟،دەبا ئەو گوێ گرەیان بێنن بە بەڵگەی ئاشکراوە،یان**

**خوا کچی هەیە بە گومانی ئەوان کوڕیش هی ئێوەیە بە پێی حەزی خۆتان ؟،یان تۆ داوای کرێیان لێ دەکەی لە سەر گەیاندنی پەیامەکەت،؟ئەوان بۆ دانی غەرامە قورسن،یان ئەوان زانستی غەیبیان لایە و چیان بوێت دەینوسن،؟یان بەڵکو دەیانەوێ پلان دابڕێژن و پەیامەکەی پوچەڵ بکەنەوە بەلام بێ باوەڕان خۆیان پلانەکانیان دەوری داون،یان پەرستراوی تریان**

هەیـە جگـە لـە خـوا کـە لـە سـزای خـوا بیانپارێزێـت ؟،پـاك و بێگەردی بۆ خوا لەوەی دەیکەنە هاوبەشی .

دووەم: بە ڵگە هێنانە وە بە دروستبون بۆ زیندوو بونـە وە،وە ك خوای گە ورە دە فـە رموێـت: ﴿ أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٥﴾ ﴾ ق

واتە: ئایا توانامان نە بوو لە وە ی یە کە مجار دروستیان بکـە یـن نـاتوانین دوبـارە دروسـتیان بکـە ینـە وە بـە ڵکـو ئـە وان لـە گوماندان لە بارە ی دوبارە دروستکردنە وە یان لە پاش مردن.

سێیە م: پوچە ڵکردنە وە ی بە ڵگە ی نـە یـار بـە دژە کـە ی،وە ك خـوای گـە ورە دە فـە رموێـت: ﴿ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ﴾ الأنعام

واتە: ئە وانە بە وشێوە یـە ڕێـزی خوایان لانییـە وە ك شایستـە یـە تـی بـە وە ی کـە نکوڵیـان لـە وە کـرد خـوا پـە یـامی خـۆی بـۆ مرۆڤ دابە زێنێت ،ئە ی پێغـە مبـە ر تـۆ پێیـان بڵـێ :کـێ ئـە وپـە یامە ی دابە زاند کە موساپێی هات کە ڕوناکی ورێنمایی بوو.

چـوارەم: دابه شـكردن بـه وه سـفكردنيان وپوچەڵكردنەوه ى ئه وه ى كه يه كێكيان حوكم بىٚ بۆى،وەك خواى گه وره ده فــه رمويْــت: ﴿ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾ الأنعام

واتـه: خـوا لـه هـه مـوو جۆرێـك لـه گيانلـه بـه ران نێـرو مێـى دروستكردووه،كه له مه ڕدا دووجووت وله بزندا دوو جووته ئه ى محمد تۆ پێيان بڵىٚ هۆى چييه ئه م ئاژه لأنـه حـه رام ده كه ن؟ئايا له به رئه وه يه نێرن؟له به رئـه مه نييه چونكه زۆر جار نێره كانيشيان بۆ خۆتان حه لأڵ ده كه ن،يان لـه بـه ر ئـه وه يـه كه مێن،كه ئه مه ش نييه،چونكه زۆر جار مێكانيشيان حـه لأڵ ده كه ن،يان له به ر ئا وسييه كه يانه؟ئه مه ش نييه چونكه هـه مـوو كـات بێچـووه كانيشـيان حـه رام ناكـه ن،بـه ڵگـه يـه كـى دروستم پـىٚ بڵێن كـه پشتـى پـىٚ ببـه سترێت لـه وحـه رام و حـه لأڵكردنه ئه گه ر ڕاست ده كه ن.

**پێنجه م: ناچار کردنی نه یار به وه ی که بانگه شه ی په یوه ستی ده کات به قسه یه ك که که س ددانی پیادانانێت،وه ك خوای گه وره ده فه رموێت: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾ واته:ئه وبێباوه ڕانه فریشته کان وپه رییه کانیان کرد به هاوبه شی خوا له کاتێکدا که خوا دروستیانی کردووه به نه فامانه کوڕوکچیان بۆ خوا بڕیاردا خواش پاك وبێگه رده له وانه ی که بۆی بڕیارده ده ن،وه داهێنه ری ئاسمانه کان وزه ویشه،چۆن منالی ده بێت که هاوسه ری نییه وهه موو شتێکی دروستکردووه وبه هه موو شتێکیش زانایه.[42]**

## چیرۆکەکانی قورئان

**بەشـــێکی زۆری قورئـــانی پـــیرۆز پێکهـــاتووە لـــە چـــیرۆکی نەتـــەوەکانی ڕابـــردو و پێغەمبـــەران و باســـی شـــارو ئـــاوایی و شـــوێنەوارەکان،ڕوداوەکان بەسـتراوە بـە هۆکـان ( أسـباب )ەوە،**

---

[42] – المصدر السابق .

مــرۆڤ هــەر بــە سروشــتی خــۆی حــەزی لــە باســکردنی چیرۆکە،چیرۆکی ڕاستەقینەش بە هێزترین کاریگەری هەیە .[43]

## جۆره كانی چیرۆك له قورئاندا

جۆری یەکەم:چیرۆکی پێغەمبەران و بانگەواز و موعجیزە کانیان وپشتگیری خوای گەورە بۆیان و هەڵوێستی نەیارەکانیان .

جۆری دووەم: چیرۆکی ئەوانەی کە پێغەمبەر نەبونە وەك چیرۆکی طــاڵـوت و جـاڵوت و هابیـل و قابیـل و هـاوەڵانی ئەشـکەوت و قارون و ئەسکەندەر و هتد ....

جــۆری ســێیەم: ئـەو چـیرۆکانەی کـە پەیوەنـدی بـە سـەردەمی پێغەمبـەرەوە (صـلی الله علیـه وسـلم)هەیـە وەك جـەنگی بـەدر و ئوحود و حونەین و تەبوك ئیسرا و میعراج و هتد..... .[44]

## حیکمەتی دووباره کردنەوەی چیرۆکەکان

قورئــانی پــیرۆز زۆربــەی چـیرۆکەکانی دووبــارە دەبێتــەوە لــە سورەتەکاندا هەریەکە و بە شێوازێك ،لەبەر ئەم حیکمەتانە:

1. بە ئاشکرا پیشاندانی ڕەوانبێژی قورئان لە بەرزترین پلەدا.

---

[43] - المصدر نفسه (279) .

[44] - المصدر السابق (240) .

2. به هێزیی ئیعجازی قورئان .

3. بۆ دامه زراوی باوه ڕداران.

4. جیـاوازی مەبەسـتِ کـه لـه پێنـاوی دا چـیرۆکه کـه دوو بارەبۆتەوە.

5. بۆ په ند لێوه رگرتن وسڵەمینه وه .[45]

مه به سته کانی چیرۆك له قورئاندا

1. چه سپاندنی نیگاو په یام.

2. هه موو ئاین له لایه ن خواوه یه.

3. بنچینه ی ئاین هه مووی یه که.

4. هۆکانی بانگه وازی پێغه مبه ران یه که.

5. بنچینه ی سه رجه م ئاینی پێغه مبه ران یه که.

6. بنچـینه ی ئـه نجـامی پێغـه مبـه ران سـه رکـه وتـن وبێبـاوه ڕانیش تیاچوونه.

7. به ڕاستدانانی موژده وئاگادارکردنه وه کان.

8. نیعمه ته کانی خوا به سه ر پێغه مبه ران و پیاوچاکانه وه.

---

[45] - الانتصار للقران (2/800-808) ، ومباحث (281) .

9. وشیارکردنه وەی نه وه کانی ئاده م له به ڕێدالابردنی شه یتان.[46]

**نه سخ له قورئاندا**

نه سخ له زمانه وانیدا واته (لابردن وگواستنه وه).

له شه رعدا:هه ڵگرتنی حوکمێکی شه رعییه به به ڵگه یه کی تری شه رعی دوای خۆی .[47]

**به شه کانی نه سخ له قو رئاندا**

نەسخ دەبێت بە چوار بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** نەسخی قورئان بە قورئان .

**بەشی دووەم:** نەسخی قورئان بە سوننەت .

**بەشی سێیەم:** نەسخی سوننەت بە قورئان .

**بەشی چوارەم:** نەسخی سوننەت بە سوننەت .[48]

که ئه بن به سێ جۆره وه به م شێوه یه :

جۆری یەکەم: نەسخی خوێندنەوە و حوکم پێکەوە .

جۆری دووەم: نەسخی حوکم و هێشتنەوەی خوێندنەوە .

---

[46] – التصور الفني في القران (144–155).

[47] – الناسخ والمنسوخ لقتادة (6)،الناسخ والمنسوخ للنحاس (57).

[48] – مناهل(2/170/177)،الناسخ والمنسوخ للنحاس (53).

جۆری سێیەم: نەسخی خوێندنەوە و هێشتنەوەی حوکم .[49]

**ئه و شتانه ی نه سخ تیایاندا دروسته**

نەسخ تەنها لە فەرمان و ڕێگرییەکاندا دروستە ئە گەرچی بە وشــه ی گـوزاره(خـبر) یـش بـیٚ بـه لاٚم گـوزاره یـه ك كـه مانـای داخوازی هه بێت نه سخ تیایدا ڕوونادات وه ك به لٚێن وهه ڕه شه ،كه واته نه سخ ته نها له ئه حكامدا هه يه،به لاٚم له بیرو باوه ڕو بنچینه ی ڕه وشت وپه رستش و مامه لٚه سه ره كییه كاندا نابێت.[50]

**مه رجه كانی نه سخ**

1. جێگیربوونی هه ر یه ك له ناسخ ومه نسوخه كه له قورئاندا به مته واتیری.
2. جێگیربوونی دواكه وتنی ناسخه كه له مه نسوخه كه له دابه زیندا.
3. قابیلی حوكمی نه سخ بێت

---

[49] – البرهان (35/2-39)، المرشد الوجيز (43/1-44)، الناسخ والمنسوخ للمقري (20) .

[50] – مناهل (152/2) الناسخ والمنسوخ لقتادة (6) ، فهم القران(251) .

4. دژایه تی له نێوان هه ردوو ئایه ته (ناسخ و مه نسوخه که )دا هه بێت.[51]

**تۆکمه ولێکچوو**

**تۆکمه( محکم ):** ئەوەیە کەماناکەی ئاشکرایە و وە تەنها یەك ماناش دەگەیەنێت ، کە زۆربەی قورئان لەم جۆرەیە .

دووەم: لێکچوو(متشابە): بریتی یە لەوەی زیاد لە مانایەك هەڵدەگرێ و ماناکەی ئاشکرا و ڕوون نیە .

زانایان دوو بۆچونیان هەیە لەوەی کە ئایا موتەشابیە ئەگونجێ عه تف بێ بۆ پێش خۆی یان نا.

**بۆچونی یەکەم:** دەڵێن عەتفە بۆ سەر بەشەکەی پێش خۆی وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ

---

[51] - التبيان لرفع غموض النسخ في القران (34-38) .

تێبینی:ڕاجیایی هه یه له نێوان زانایاندا له سه رنه سخ له قورئاندا،بۆیه زۆر به کورتی هێناومانه،وبابه تی حیکمه ته کانی نه سخیشمان نه هێناوه .

(٧) ئەمــە بۆچــونی ئــیبن عەباســە لــە ڕێگــەی موجاهیــدەوە هــاتوە ،زوحــاك دەڵــێ: (وَالرَّاسِــخُونَ فِــي الْعِلْــمِ ) ماناکەی دەزانن خۆ ئەگەر ماناکەیان نەزانیایە ناسخ و مەنسوخ و حەڵاڵ و حەرامیان نەدەزانی پێشەوا نەوەویش ئەم بۆچونەی هەڵبژاردووە .

**بۆچونی دووەم:** کە بۆچونی زۆرینەیە لە هاوەڵان و تابعین.

بــە تایبــەتیش ئــەهلی سوننە،ئەمەبۆچــونی دووەمــی ئــیبن عەباسیشە،ئیبن سەمعانی دەڵــێ بۆچونی یەکەم هــی کۆمــەڵێکی زۆر کەمــە پێشــەوا بوخــاری و موســلیم دەگێڕنــەوە لــە خــاتو عائیشــەوە دەڵــێ: پێغەمبــەری خوا (صــلى الله عليــه وسلم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ( هوالذي أنزل عليك الكتب) تـا (وأولواالبـاب )[52]

دەڵــێ:پێغەمبــەری خــوا (صــلى الله عليــه وســلم) فــەرموی: (فـإذا رأيــت الــذين يتبعــون مــا تشــا بــه منــه فأولئــك الــذين سمــى الله،فأحذرهم) واتە: هەرکاتێ ئەوانەت بینی شوێن موتـە شـابيهە

---

[52] – الاتقان (300–301) .

کان ده که ون ئه وه ئه وانه ن که خوا سه رزه نشتیان ده کات وریایان به.[53]

## تەفسیر

تەفسیر:له زمانەوانیداله(فسر)ه وه هاتووه واته:ڕونکردنەوه .[54]

له زاراوەدا: زانستێکه به هۆیه وه لـه و کتێبه ی خوا تێده گه یت که دابه زیوه بۆ سه ر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و ڕونکردنه وه ی ماناکانی وده رهێنانی حوکم و په نده کانی.[55]

## ئەو زانستانەی پێویستن بۆ ڕاڤەکاری قورئان

ڕاڤەکاری قورئان (مفسر) پێویسته پانزه زانستی تیا بێ :

یەکەم: زانینی قورئان .

دووەم: زانینی سوننەت .

سێیەم: زانینی ژیانی پێغەمبەر و هاوەڵان .

چوارەم: زانینی مێژووی قورئان .

پێنجەم: زانینی بنەماکانی ڕاڤەی قورئان .

---

53 – متفق علیه .

54 – مختار الصحاح (503) .

55 – الاتقان (174/2) .

شەشەم: زانینی زمانی عەرەبی .

حەوتەم: زانینی نەحو و صەرف .

هەشتەم: زانینی ڕەوانبێژی عەرەبی .

نۆیەم: زانینی شێوە قورئان خوێندنەکان .

دەیەم : زانینی بیر و باوەڕی ئیسلامی.

یانزەیەم: زانینی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی .

دوانزەیەم: زانینی مێژووی جاهیلی عەرەب .

سیانزەیەم: زانینی مێژووی پێشین .

چواردەیەم: زانینی ڕێچکە فیکری یە جیاوازەکان .

پانزەیەم: ڕۆشنبیری زانستی هاوچەرخ .[56]

## جۆرەکانی تەفسیر

1 . تەفسیرێك کە عەرەب بە زمانەکەی خۆی دەیزانێت .

2 . تەفسیرێك کە بیانو وپاساو بۆ کەس نیە نەیزانێت .

3 . تەفسیرێك کە تەنها زانایان دەیزانن .

4 . تەفسیرێك کەس نایزانێت جگە لە خوای گەورە .[57]

---

[56] - مناهج المفسرين (111- 112)، وعلوم القران (417-419) .

[57] - مناهل العرفان (9/2) ، كيف نتعامل مع القران العظيم (201- 202) .

## چاكترين ڕێباز بۆ تە فسیر

چاكترين ڕێگە بۆ تەفسير كردنی قورئان لای ئەهلی سوننە:

يەكەم: تەفسيری قورئان بە قورئان .

دووەم: تەفسيری قورئان بە سوننەت .

سێيەم: تەفسيری قورئان بە تێگەيشتنی پێشينی چاك (هاوەڵان وتابعين) .

چوارەم: تەفسيری قورئان بە زمانی عەرەبی .

پێنجەم: تە فسير بە بۆچونی سە رچاوە گرتوو لە شە رعە وە.[58]

## جۆرە كانی تە فسير لە ڕوانگە ی زانستييە وە

تەفسير لە ڕووی زانستی يەوە دەبێت بە دوو بەشی سەرەكی يەوە:

يەكەم: تەفسيری مە ئثور .

دووە م: تەفسيری ڕە ئيی .

---

[58] - مقدمة في اصول التفسير(36-38)،ومناهج المفسرين (107).

## یەکەم: تەفسیری مە ئثور

تەفسیری مە ئثورئەوە یە لە خودی قورئاندا یان لە سوننە تدا یان لە وتە ی هاوەڵانداهاتووە وە ك ڕونكردنە وە یە ك بۆ مـە بـە ستی خوای گە ورە لە قورئاندا.[59]

## هۆكانی لاوازی تە فسیری مە ئثور

یەکەم: تێکەڵکردنی ئیسرائیلیات .

دووەم: لابردنی سەنەدەكان .

سێیەم: هەڵبەستراوی زۆر لە ناو تەفسیرەکەدا.[60]

## گرنگترین دانراوە كانی تە فسیری مە ئثور

1.(تفسیر القران الكريم)ی سوفیانی سە وری.

2. (جامع البيان في تفسيرالقران ) ی پێشەوا طە بە ری.

3. (تفسيرالقران العظيم ) ی پێشەوا (ابن كثير ).

4. (الدر المنثور في التفسير بالماثور)ی سیوطی.[61]

---

[59] – مناهل العرفان (10/2)..وكيف نتعامل مع القران العظيم (220-237).

[60] – المصدرالسابق (18/2-19) .

[61] – مناهج المفسرين (49-66) .

## چاکترین ڕێباز بۆ ته فسیر

چاکترین ڕێگه بۆ تەفسیر کردنی قورئان لای ئەهلی سوننه:

یەکەم: تەفسیری قورئان به قورئان .

دووەم: تەفسیری قورئان به سوننەت .

سێیەم: تەفسیری قورئان به تێگەیشتنی پێشینی چاك (هاوەڵان وتابعین) .

چوارەم: تەفسیری قورئان به زمانی عەرەبی .

پێنجەم: ته فسیر به بۆچونی سه رچاوه گرتوو له شه رعه وه.[58]

## جۆره کانی ته فسیر له ڕوانگه ی زانستییه وه

تەفسیر له ڕووی زانستی یەوه دەبێت به دوو بەشی سەرەکی یەوه:

یەکەم: تەفسیری مه ئثور .

دووه م: تەفسیری ڕه ئیی .

[58] - مقدمة في اصول التفسير(36-38)،ومناهج المفسرين (107).

## یەکەم: تەفسیری مە ئثور

تەفسیری مە ئثورئەوە یە لە خودی قورئاندا یان لە سوننە تدا یان لە وتە ی هاوەڵانداهاتووە وە ك ڕونكردنە وە یە ك بۆ مە بە ستی خوای گە ورە لە قورئاندا.[59]

## هۆكانی لاوازی تە فسیری مە ئثور

یەكەم: تێكەڵكردنی ئیسرائیلیات .

دووەم: لابردنی سەنەدەكان .

سێیەم: هەڵبەستراوی زۆر لە ناو تەفسیرەكەدا.[60]

## گرنگترین دانراوە كانی تە فسیری مە ئثور

1.(تفسير القران الكريم)ی سوفیانی سە وری.

2. (جامع البيان في تفسيرالقران ) ی پێشەوا طە بە ری.

3. (تفسيرالقران العظيم ) ی پێشەوا (ابن كثير ).

4. (الدر المنثور في التفسير بالماثور)ی سیوطی.[61]

---

[59] – مناهل العرفان (10/2)،.وكيف نتعامل مع القران العظيم (220–237).

[60] – المصدرالسابق (18/2–19) .

[61] – مناهج المفسرين (49–66) .

**دووه م: ته فسیر به بۆچوون ( ڕه ئیی )**

**پێچه وانه ی جۆری ته فسیری پێشووه .**

**حوکمه که ی**

زانایان بۆچونیان جیاوازه له باره ی گێڕانه‌وه ی ئه م جۆره ته فسیره:

بۆچونی یه که م: دروست نیه ته فسیر به بۆچون وڕه ئیی بکرێت.

بۆچونی دووه م: دروسته به لاّم به م چوارمه رجه:

1. وه رگیرابێت له پێغه مبه ر(صلى الله عليه وسلم) . 2. له هاوه لاّن. 3. له زمانی عه ره بییه وه . 4. له چوارچێوه یه کی شه رعیدا بێت.[62]

**گرنگترین ته فسیره کانی ڕه ئیی**

1 . (السراج المنير)ی خه تیبی شه ربینی.

2 . (أنوار التنزيل و اسرار التأويل ) ی به یضاوی .

[62] - مناهل العرفان (2/36-37) .

3 . (مدارك التنزيل و حقائق التاويل ) ى نەسەفى .

4 . (إرشاد العقل السليم إلى مزايا القران الكريم)ى ئە بى سعود.

5 . ( روح المعاني في تفسير القران العظيم والسبع المثانى ) ى ئالوسى .[63]

## قۆناغە كانى نوسينى تە فسير

### يە كە م: تەفسير لە سەردەمى هاوەڵاندا :

هاوەڵان (خوا لێيان ڕازى بێ ) چونكە بەزمانى ئەوان دابەزى لێى تێدەگەيشتن و پێغەمبەريش (صلى الله عليه وسلم) تەفسيرى ئەو ئايەتانەى بۆ دەكردن كە نەيان دەزانى ،ئەوانيش بە پێى ڕۆشنبيرى هەريەكێكيان تێگەيشتنيان جياواز بوو،ئەنەس دەڵێ:عومەرى كوڕى خەطاب لە سەر مينبەر ئەم ئايەتەى خوێند﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ ﴾ وتويەتى:ئەوە ئەزانين ( وَفَاكِهَةً ) چى يە،بەلأم (ابا) چى يە؟پاشان بە خۆى وت :بە ڕاستى زانينى ئەمە زۆر لە خۆ كردنە ئەى عومەر ،ئيبن عەباس دەڵى: نەمدەزانى (فاطر) چى يە تا دوو ئەعرابى هاتن بۆ لام و

[63] – المصدر السابق (48/2) .

دەمە قاڵەیان بوو لە بارەی کێشەی بیرێکەوە ،یەکێکیان دەیوت (أنا افطرتها ) واتە: من یەکەم کەس بومە هەڵم کەندوە .

هاوەڵان بۆ تێگەیشتن لە ئایەتەکان پشتیان بەم سێ سەرچاوانە دەبەست:

یەکەم: قورئان وەك تێگەیشتن لە ئایەتە کورتەکان بە ئایەتە درێژەکان (مفصل) ەکان

دووەم: پێغەمبەر: کە باسمان کرد پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەفسیری هەندێ ئایەتی بۆ دەکردن کە نەیاندەزانی .

ئیبن مەسعود دەڵێ: کاتێ ئایەتی ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ الأنعام

دابەزی لە سەر خەڵکی نارەحەت بوو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کێ هەیە لە ئێمە ستەم لە خۆی نەکات ؟ فەرموی ئەو ستەمە ئەوە نیە کە ئێوە لێی تێگەیشتون ئایا نەتان بیستوە ؟ ئەو ئایەتەی کە پیاو چاکەکە دەڵێ : ﴿ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾

بــه ڕاســتی ئــەو زوڵمــه شــیرکە، هــەروەها لــە بــارە ی ســورەتی(الكـوثر)ە وە دەفــەرموێت: (كەوســەر ڕوبارێكــه لــه بەهەشتدا پەروەردگارم پێی بەخشیوم).

سێیەم:تێگەیشتن و ئیجتهادی خۆیان: هاوەڵان ئەگەر تەفسیری ئایـەتێكیان لـە قورئانـدا یـان لـە لای پێغەمبـەر (صلى الله عليـه وسلم) دەست نەكەوتایە چونكە عەرەبیەكەیان پاراو بوو خۆیـان ئیجتیهادیـان دەكرد،بـەڵام لـەو سـەردەمەدا تەفسـیر نەدەنوسـرا ،چـونكە نوسـینی تەفسـیر لـە سـەردەمی دووەمـدا دەسـتی پـیٚ كرد.[64]

دووەم: تەفسیر لە سەردەمی تابعیندا

هەروەك چۆن لە ناوهاوەڵاندا كۆمەڵێك نـاو بـانگیـان دەركـرد لـە تەفسیردا وەك ( چوار خەلیفەكە و ئیبن عەباس و ئیبن مەسعود و زەیدی كوڕی ثابت و ئەبو موسـاو چـەندینی تـر....بە هـەمان شـێوە لـە نـاو تابعینیشـدا كۆمـەڵێك ناوبانگیـان دەركـرد لـەو مەیدانــەدا كــه ئــەوانیش لــەو كۆمەڵــە هاوەڵــە موفەســیرەوە

[64] – التفسير والمفسرون (28-29) ، مناهج المفسرين (209-247) .

وەریانگرتبو لە قوتابی یەکانی ئیبن عەباس سەعیدی کوڕی جوبەیر و موجاهید و عکرەمە و خزمەتکاری ئیبن عەباس و طاوس و عە طاء،لە قوتابی یەکانی ئیبن مەسعودیش زەیدی کوڕی ئەسلەم و ئەبو عالیە و محمدی کوڕی کەعب بەم شێوەیە تەفسیر لەو سەردەمەشدا بە گێڕانەوە پارێزگاری لێ کرا،بەلاّم دوای ئەوە گاور و جولەکەی زۆر لەو سەردەمەدا موسڵمان بوون تابعین ئیسرائیلیاتی زۆریان لێوە وەرگرتن لەو کەسانەش کە ئەو ئیسرائیلیاتانەیان هێنا عەبدوڵلاّی کوڕی سەلام و کەعبی ئەحبار و وەهەبی کوڕی مونەبەه .[65]

**سێیە م: تەفسیر لە سەردەمەکانی نوسینەوەدا**

نوسینەوەی تەفسیر لە کۆتایی یەکانی سەردەمی بەنی ئومەیەو سەرەتاکانی سەردەمی عەباسیەکاندا دەستی پێ کردو فەرمودەش پشکی گەورەی لەمەدا بەرکەوت ،نوسینەوەی فەرمودە چەندین بابی جۆر بە جۆری لە خۆ گرت ، تەفسیریش کرا بە بابێك لەو بابانە، کۆمەڵێك سور بون لە سەر گێڕانەوەی

[65] - مباحث (309-311) .

تەفسیر کە دراوەتە پاڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یان هاوەڵان یان تابعین لە گەڵ گرینگیدانیشیان  بە کۆکردنەوەی فەرموودە،لە پێش هەموو ئەوانەشەوە یەزیدی کوڕی هارون و شوعەیبی کوڕی حەجاج  و وەکیعی کوڕی جەڕاح و سوفیانی کوڕی عەیینە و ڕوحی کوڕی عوبادە و عەبدوڕەزاقی کوڕی هەمام و ئادەمی کوڕی ئەبی ئیاس و عەبدی کوڕی حەمید .بەڵام تەفسیری هیچ کام لەمان نەگەیشتووە بە ئێمە بەڵکو زانایان لە تەفسیرە کانیاندابۆمان دەگێڕنەوە .دوای ئەوان تەفسیر وەك زانستێکی سەربەخۆ و جیا لە فەرموودە بە پێی ڕیزبەندی قورئان وەك: ئبن ماجە و ئبن جەریری طەبە ری و ئەبو بەکری کوڕی مونذیر و چەندین زانای تر

پاشان دوای ئەوان کۆمەڵێك موفەسیری تر هاتن کە سنوری تەفسیری مە ئثوریان تێ پەڕاند جۆرەها وتەی جیاوازیان تێکەڵ بە تەفسیرەکانیان کرد بە بێ ئەوەی بیدەنە پاڵ خاوەنەکانیان ،ئیتر لەوەوە عیلمی کەلام  و فەلسەفە و دەمارگیری بۆ مەزهەب وچەندین کاری تری گروپەکان (فرق ) برەوی پێ درا.[66]

---

[66] - المصدر السابق (311-313) .

**هەڵەی هەندێ لە موفەسیران**

1. تەفسیرکردنی قورئان بە عەقڵ و فکری تاکە کەسی .

2 . بە هەڵە تێگەیشتن لە هەندێ ئایەت .

3 . شوێن نەکەوتنی چاکترین ڕێگەکانی تەفسیر .

4 . پشت نەبەستن بە فەرمووده ڕاستەکان لە کاتی تەفسیردا .

5 . نەرمی نواندن لە گێڕانەوە ی ئیسرائیلیاتەکاندا .

6. گرنگی نەدان بە دە خوێندنەوە ڕاستەکەی قورئان .

7. نەرمی نواندن لە کاتی وەرگرتنی وتەی هاوەڵان و تابعیندا و جیانە کردنەوەی ڕاست و ناڕاستەکانیان .

8. دەرچون لە مەبەستە سەرەکی یەکە بۆ کۆمەڵە باس و بابەتێك کە پەیوەندی بە تەفسیرەوە نی یە .

9. خۆ سەرقاڵ کردن بە جەنگی فکری جیاواز و دەمەقاڵەی نەزۆك لە گەڵ تاقمەکاندا

10. باسـكردنی ئیحتیمـالات و گریمانـەی جیاجیـا لـە كـاتی تەفسیردا .[67]

**بە ناو بانگترین تاقمە لادەرەكان لە تەفسیردا**

**یە كە م: موعتەزیلە ، لە تەفسیرەكانیان :**

1. ( تنزیە القران عن المطاعن )ی قازی,

2. ( الكشاف ) ی زەمەخشەری .

**دووەم: شیعە، لە تەفسیرەكانیان**

1. (تفسیر التبیان)ی طوسی,

2. (تفسیر الصافي)ی كاشی.

3. (تفسیر مراة الانوار ومشكاةالاسرار)ی كازلی.

**سێیەم: خەواریج لە تەفسیركانیان**

1. (همیان الزاد الی دار المعاد) ی وەهبي.

**چوارە م: سۆفییە كان،لە تە فسیرە كانیان**

1. (لطائف الاشارات)ی قوشە یری.

2. (حقائق التفسیر)ی سلمي.[68]

---

67 – مناهج المفسرين .

68 – مناهج المفسيرين ، التفسير والمفسيرين .

## ئادابه كانی قورئان خوێن

1. ته نها ڕه زامه ندی خوای گه وره بێت له خوێندندا.

2. پارێزكاری و له خواترسان دروشمی بێت.

3. ڕه وشتی قورئانی بێت.

4. له سه ره تادا په نا بگرێت به خوای گه وره.

5. به ده نگی خۆش بیخوێنێت.

6. ئه گه رتوانی ڕوو بكاته قیبله.

7. به ڕێزه‌وه بچێته خزمه ت قورئان بۆ خوێندنی.

8. به هێواشی و له سه رخۆیی بیخوێنێت.

9. له شوێنی چۆ ڵ وهێمندا بیخوێنێت.

10. له شوێنی ئاوه داندا به ده نگی به رز نه یخوێنێت.

11. وه ك ئاوازی گۆرانی نه یخوێنێت.

12. قورئانه كه له ناوكۆشی یان شوێنی به رز دابنێت.

13. دوای ته واوبون قورئانه كه به كراوه یی جێنه هێڵێت.

14. هه وڵبدا زیاتر له شه ودا بیخوێنێت.

15. پاش هه ر خه تمێك هه وڵی خه تمی تر بدات.

16. پاش خه تمكردن بپاڕێته‌وه.

17-به‌سام وهه‌یبه‌ته‌وه بیخوێنێت

18-قورئانه كه زۆر بپارێزێت له پیسی

19-ده مه قالێی پیٚ نه‌كات

20-به‌ڵێندان به قورئانه‌كه بۆ به‌رده‌وامبون له‌سه‌ری[69]

[69] - تفسير القرطبي (1/27-31) ، التبيان للنووي (31و54و63) ، اخلاق اهل القران (77)،علوم القران،عادل كمال(127-145)

## سەرچاوەكان


1. القران الكريم
2. الاتقان في علوم القران،جلال الدين السيوطي،الناشر: دارالفكرللطاعة والنشر والتوزيع، بيروت, لبنان ،1429هـ-2008م.
3. اخلاق اهل القران، ابوبكر محمد بن الحسين بن عبدالله الاجري، تحقيق:محمد عمرو عبداللطيف ، الطبعة الثالثة ،1424ه-2003م.
4. اسباب نزول القران،ابوالحسن علي بن احمدبن محمدبن علي الواحدي ،تحقيق: كمال بسيونى زغلول ،الناشر: دارالكتب العلمية- بيروت،الطبعة الاولى1411ه.
5. اسرار ترتيب القران،عبدالرحمن بن ابي بكر،جلال الدين السيوطي،الناشر:دار الفضيلة للنشر والتوزيع.
6. الاحرف السبعة،عثمان بن سعيد بن عثمان بن عمر ابوعمرو الداني ،تحقيق: د.عبدالمهيمن طحان،الناشر: مكتبة المنارة- مكة المكرمة،الطبعة الاولى 1408ه.
7. الانتصارللقران، محمد بن الطيب بن محمد بن جعفر بن القاسم المعروف بابي بكر الباقلاني، تحقيق : د.محمد عصام القضاة، الناشر:دار الفتح, عمان،دارابن حزم, بيروت ،الطبعة الاولى،1422ه-2001م.

8. البرهان في علوم القران ،ابوعبدالله بدر الدين محمد بن عبدالله بن بهادر الزركشي، تحقيق: محمد ابوالفضل ابراهيم ،الناشر: دار احياء الكب العربية،الطبعة الاولى1379ه-1957م.

9. التبيان لرفع غموض النسخ في القران، د.مصطفى ابراهيم الزلمي،الناشر:مكتب تفسير, اربيل،الطبعة الثانية.

10. التبيان في اداب حملة القران،ابوزكريا محي الدين يحيى بن شرف النووي، تحقيق: محمد الحجار،الناشر:دارابن حزم،بيروت,لبنان،الطبعة الثالثة،1414ه-1994م.

11. تنبيه الخلان بتكميل مورد الضمان،ابومحمد بن عبدالواحد بن احمد بن احمد بن عاشر الانصاري،الناشر: دارالحديث للطبع والنشر والتوزيع،1426ه-2005م.

12. التصور الفني في القران،سيد قطب ابراهيم حسن الشاربي،الناشر:دار الشروق،الطبعة السابعة عشرة.

13. التفسير والمفسرون، د.محمد السيد حسن الذهبي، الناشر: مكتبة وهبة- القاهرة.

14. تيسير مصطلح الحديث، د.محمود الطحان،الناشر:مكتبة المعارف للنشر والتوزيع،1425ه-2004م.

15. جامع البيان في تاويل القران، محمد بن جرير بن يزيد بن كثير بن غالب الاملي ابوجعفر الطبري،تحقيق: احمد محمد شاكر،الناشر:مؤسسة الرسالة،الطبعة الاولى1420ه-2000م.

16. الجامع لاحكام القران، ابو عبدالله محمد بن احمد بن ابي بكر بن فرج الانصاري الخزرجي شمس الدين القرطبي، تحقيق: احمدالبردوني، وابراهيم اطفيش،الناشر: دارالكتب المصرية,القاهرة، الطبعة الثانية 1484ه-1964م.

17. دراسات في علوم القران، محمد بكر اسماعيل،الناشر: دار المنار،الطبعة الثانية،1419ه-1999م

18. روائع البيان، محمد علي الصابوني،الناشر:المكتبة العصرية،صيدا,بيروت،1426ه-2005م.

19. السبعة في القراءات،احمد بن موسى بن العباس التميمي،تحقيق:شوقي ضيف، الناشر: دارالمعارف، مصر،الطبعة الثانية1400ه.

20. علوم الحديث، د.عبدالكريم زيدان وعبدالقهار داود عبدالله،الناشر: مؤسسة الرسالة، بيروت , لبنان،الطبعة الاولى1429ه-2008م.

21. علوم القران للصف الرابع الاعدادي، د.محسن عبدالحميد, د.رشدي عليان,د.غانم قدوري،الناشر: مكتبة الشموع, بغداد،1426ه - 2075كوردي-2005م.

22. علوم القران الكريم، د.يوسف مرعشلي،الناشر: دار المعرفة،الطبعة الاولى1431ه2010 م.

23. فضائل القران، ابوعبدالله محمد بن ايوب بن يحيى بن الضريس،تحقيق:غزوة بدير،الناشر: دارالفكر،دمشق, سورية، الطبعة 1408ه -1987 م.

24. فنون الافنان في عيون علوم القران،جمال الدين ابو الفرج عبدالرحمن بن علي بن محمد الجوزي،الناشر: دارالبشائر،بيروت, لبنان،الطبعة الاولى1408ه-1987م.

25. فهم القران ومعانيه،الحارث بن اسد المحاسبي، تحقيق:حسن القوتلي،الناشر: دارالكندي, دارالفكر, بيروت،الطبعة الثانية1398ه.

26. القران وعلومه والحديث وعلومه، محمد احمد خلف الله،الناشر:المؤسسة الرسالة،الطبعة الاولى1986م.

27. كيف نتعامل مع القران العظيم، د.يوسف القرضاوي، الناشر:دارالشروق,القاهرة، الطبعة الاولى1419ه-1999م.

28. مختار الصحاح، زين الدين محمد بن ابي بكر بن عبد القادر الرازي،تحقيق: حمزة فتح الله، الناشر: مؤسسة الرسالة 1414ه-1994م.

29. مباحث في علوم القران، مناع القطان، الناشر: مؤسسة الرسالة، الطبعة الخامسة والثلاثون 1418ه - 1998 م.

30. المرشد الوجيزالى علوم تتعلق بالكتاب العزيز،ابوالقاسم شهاب الدين بن عبدالرحمن بن اسماعيل بن ابراهيم المقدسي، تحقيق:طيار التي قولاج، الناشر: دارصادر,بيروت، 1395ه -1975م.

31. مصاحف ابن ابي داود (كتاب المصاحف)،ابوبكر بن ابي داود السجستاني، تحقيق:محمد بن عبده،الناشر: الفاروق الحديثة،مصر,القاهرة، الطبعة الاولى142ه-2002م.

32. مقدمة في اصول التفسير،تقي الدين ابوالعباس احمد بن عبدالحليم بن عبدالسلامبن عبدالله بن ابي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني،الناشر: دارمكتبة الحياة، بيروت- لبنان1490ه-1980م.

33. مناهل العرفان في علوم القران، محمد عبدالعظيم الزرقاني،الناشر: دار الفكرللنشر والتوزيع، بيروت,لبنان،1429ه-2008م.

34. مناهج المفسرين،مسلم الجعفر ومحي هلال السرحان،الناشر: دارالمعرفة،الطبعة الاولى1980م.

35. النبا العظيم، محمد بن عبدالله دراز،الناشر: دار القلم للنشر والتوزيع،1426ه-2005م,

36. الناسخ والمنسوخ،قتادة بن دعامة بن قتادة بن عزيز المعروف بابوالخطاب السدوسي،تحقيق:حاتم صالح الضامن،الناشر:مؤسسة الرسالة،الطبعة الثالثة1418ه-1998م.

37. الناسخ والمنسوخ،ابوجعفر النحاس احمد بن محمدبن اسماعيل بن يونس المرادي،تحقيق: د.محمدعبدالسلام محمد،الناشر:مكتبة الفلاح,الكويت،الطبعة الاولى1048ه.

38. الناسخ والمنسوخ،ابوالقاسم هبة الله بن سلامة بن نصربن علي البغدادي المقري،تحقيق:زاهير الشاويش,محمد كنعان،الناشر:المكتب الاسلامي,بيروت،الطبعة الاولى1404ه.

## پێرست